# رابه ری کیشـــی

# شیعـــری کلاسیکی کوردی



تـــالیف : عـــزیز گـــه ردی

## تێبینی:

داوای لێبوردن لە خوێنەری بەڕێز دەکەم کە لەکاتی ڕاکێشانی ئەم کتێبە لە کۆمپیوتەرەوە بۆ سەر ترێسی کاغەز ئەم چل ویەک لاپەڕە یەی لێرە بەدوواوە، لەنێوان لاپەڕە (٣٣٦) و لاپەڕە (٣٣٧) پەڕیون.

واتە خوێندنەوەی لاپەڕەکان بە پێی ئەم ڕیزەی خوارەوە دەبێ:

[ ٣٣٥، ٣٣٦، ا ،ب ، پ ، ت ، ج ، چ، ... أا ، أب

، أپ ، أت ، أج ، أچ ... ٣٣٧، ٣٣٨ ... ]

# پێشەکی

ئەم ڕابەرە، هەر وەکو لەناونیشانەکەیەوە دیارە(ڕابەری کێشی شیعری کلاسیکی کوردی)، تایبەتە بەکێشی شیعری کلاسیکی، واتە بەکێشی عەرووزی و تەنیا ئەو شیعرانەی شاعیرەکان دەگرێتەوە کە بە عەرووزی دەستکاریکراوی عەرەبی هۆنراونەتەوەو ئەو شیعرانە ناگرێتەوە کە بەکێشی برگەیی(کێشی پەنجەیی، یان سیلاب یان خۆماڵی)نووسراون.

زۆر ڕای جۆراوجۆر لەبارەی سەرەتای شیعری کوردی هەیەو زۆربەشیان ناکۆکن و ناگەنەوە یەک، بەڵام گومان لەوەدا نییە کە تا پاش ئیسلام نموونەی وامان بەدەستەوە نییە قەناعەتمان پێ بێنێ کە شیعری کوردی لە ڕادەیەکی وابووبێ سەنگێکی تایبەتی هەبووبێ، ئەوەش هەیە هەندێ لێکۆڵەرەوە سەرەتای شیعری کوردی بۆ سروودەکانی ئەڤێستا دەبەنەوە.. بەهەر حاڵ دەرکەوتنی شیعری کوردی دوای ئیسلام لەمەیدانی کێشەوە بە دوو ڕێبازدا هاتووە:

یەکەم: ئەو شیعرانەی بەکێشی برگەیی(خۆماڵی)نووسراون. ئەم جۆرە لەتایبەتێتییەکانی زمانی کوردی هەڵدەقوڵێ و مۆرکی ڕەسەنایەتی خۆی پێوەیە، بۆیە هەر هەموو شیعرو سروود و گۆرانی فۆلکلۆری بەم جۆرە کێشە ڕێکخراون، جگە لە شیعری زاری گۆران (هەورامی)، کە هەر هەمووی، جگە لە چەند نموونەیەکی کەم نەبێ، بەم جۆرە کێشە نووسراوە(٥+٥ برگە).

دووەم: ئەو شیعرانەی بەکێشی عەرووزی دەستکاریکراو نووسراون، ئەم جۆرە کێشە هەر لە کۆنەوە (باباتاهیری هەمەدانی ٩٣٥-١١٠٠) لەڕێی شیعری فارسییەوە هاتۆتە ناو ئەدەبی کوردی و شاعیرانی کورد پەیڕەوی کێشی عەرزوویان کردووە. دوای باباتاهیر، یەکەم کەس جزیری توانی ئەم جۆرە کێشانە بەزۆربەی قاڵب و دەستوورەکانەوە بێنێتە ناو شیعری کوردی و پاش ئەویش شاعیرانی زارەکانی تر پەرەیان پێداو کێش و قاڵبەکێشی تریان تێدا خستەکار.

نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێ کە کێشی برگەیی، کێشی ڕەسەنی کوردییەو کێشی عەرووزی بێگانەیە بە خەسیەتەکانی زمانی کوردی و لەسەردەمی بابا تاهیرەوە خزایە ناو شیعری کوردی و لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە وردە وردە پشتی تێکراو ئەویش کشایەوە دواوەو جێگای بۆ کێشی برگەیی چۆڵ کرد کە لەو سەردەمە بەدواوە کەوتە نەش و نما و گەشەی کرد تا وای لێهات ئێستا بەدەگمەن تەنیا شاعیرانی سەر بەڕۆشنبیری کلاسیکی دەگەڕێنەوە سەری و بەکاری دێنن، ئەگەر نا کەس ئاوڕی لێ ناداتەوە.

**بایەخدانی من بەم زانستە:**

سەرەتای بایەخدانی من بەزانستی عەرووز بۆ سەرەتای حەفتاکان دەگەڕێتەوە.. ئەوسا لەڕێی چەند سەرچاوەیەکی باشی عەرەبییەوە توانیم تاڕادەیەک لەو زانستە شارەزابم و تەنانەت یەک دووجار وتاریشم لەو بابەتە بڵاوکردەوە. یەکێکیان ناوبژی کردنی نێوان دوو

مامۆستا بوو: (هەردی)و (ڕەئووف عوسمان) کە یەکەم باسێکی پوختی لەسەر کێشی کوردی لە ژمارە (١٠) ی گۆڤاری (برایەتی)دا بڵاوکردبوەوەو دووەم لەژمارە(١٢)ی هەمان گۆڤاردا وەڵامی دابوەوە، منیش بە سێ حەلقە هەردوو باسەکەم بەشێوەیەکی زانستی هەڵسەنگاند، بەڵام بایەخدانی قووڵتری من بەو زانستە بۆ ساڵانی ١٩٨٦-١٩٨٧و١٩٨٧-١٩٨٨ دەگەڕێتەوە کە وانەبێژی عەرووز بووم لە بەشی کوردی کۆلیجی ئادابی زانکۆی سەلاحەدین.. لەگەڵ وانەگوتنەوەدا هەوڵمدا شیعری دیوانە کلاسیکییەکان شی بکەمەوە و کێشەکانیان لێک جیابکەمەوە، دوای ئەم دووساڵەش من هەر بەردەوام بووم و هەرکاتێ دیوانێکی تازەم بکەوتایە بەردەست، یان شتێکی تازە بڵاوبکرایەوە خێرا کێشی شیعرەکانم دەنووسییەوە.

ساڵی ١٩٩٢-١٩٩٣ پاش هەوڵ و تەقەللایەکی زۆر، لەماستەری ئەدەبی کوردی وەرگیرام، تا ئەوکاتە زۆربەی هەرە زۆری دیوانە باوەکانم لەڕووی کێشەوە شی کردبووەوە، بۆیە بڕیارم دا نامەی ماستەرەکەم لەسەر(کێشی شیعری کلاسیکیی کوردی و بەراورد کردنی لەگەڵ عەرووزی عەرەبی و کێشی شیعری فارسی)دا بێ. کرۆکی نامەکەم لەسەر بنەمای ئەو ئەژمارە هەستابوو کە بۆ کێشی عەرووزی شیعری کلاسیکی کوردی کردبووم.. کێش و قاڵبەکێشەکانم لێک جیاکردەوەو نموونەم بۆ زەرب و عەرووزی جیاوازی هەریەکەیان هێنا و زیحاف و عیللەی کێشەکانم بە نموونەوە دەرخست و پاشان کێش و قاڵبە کێشەکانم لەگەڵ کێشی شیعری عەرەبی و فارسی بەراورد کرد. لە چارەکە سەعاتی یەکەمی دانیشتنی تاوتووکردنی نامەکەم، کە باسی چۆنیەتی ئەنجامدانی کارەکەمم کرد ئاماژەم بەوەکرد، کە ئەژمارێکی گشتیم بۆ زۆربەی هەرەزۆری دیوانە کوردییەکان کردووەو لەدەرفەتێکدا وەکو (ڕابەری کێشی شیعری کلاسیکی کوردی) بڵاوی دەکەمەوە. بەڵام تا ئێستا ئەم دەرفەتەم بۆ هەڵنەکەوتبوو، ڕەنگە ئەم دواکەوتنە خێری ئەوەی تێدابووبێ کە لەو ماوەیەدا زۆر دیوانی نوێ دەرچوون و ئەوانیش جێگای خۆیان لەناو ئەم ڕابەرەدا گرت.

**پرۆگرامی کارکردن:**

دوای دەرهێنانی کێشی شیعری هەموو هۆنراوەکانی هەر دیوانێک کەرەستەیەکی زۆرم لەلاکۆبووەوە. مایەوە ئەوە چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەو کەرەستەیە بکەم و چۆن ڕێکی بخەم.. یەک لەدوای یەک ئەم سێ پرۆگرامەم بەکارهێنا.

**پرۆگرامی یەکەم:**

لە هەر دیوانێکدا، بۆ هەر قاڵبە کێشێک یەک نموونەی شیعری دیوانەکەم نووسی، ئینجا لەسەراپای دیوانەکە هەر شیعرێک لەسەر ئەو کێشە بوو، تەنیا ژمارەی لاپەڕەکەم لەتەک قاڵبەکێشەکە نووسی، ئەگەر لاپەڕەیەکی دیوانەکە لە شیعرێک زیاتری تێدا بووبێ بە(أ،ب،ج..) ئاماژەم بۆکردن، پاشان ژمارەی هۆنراوەکانی هەر قاڵبە کێشێکیش و هەر کێشێکم دەرهێناو ڕێژەی سەدی قاڵبەکان بۆ کێشەکەی خۆیان و ڕێژەی سەدی هەر

کێشێک بۆ سەرجەمی شیعرەکانم دەرهێنا وەکو ئەم نموونەی خوارەوە کە کێشی شیعرەکانی نالی چاپی دکتۆر مارف پێشان دەدا:

یەکەم:- کێشی هەزەج: (مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)×٢

أ- هەزەجی هەشتی تەواو: مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)×٢

تەبەسسوم دەردەخا حوققەی دەمی جەوهەر لەنێو ئەودا
بەڵێ میسقاڵە زەڕڕە زاهیرە جلیوەی لە پرتەودا (ل٤٧ب).

- (٧٥ب، ٨١، ٩٤،٩٧،١٩٨،١٠٠ب، ١١٠٣، ١١٠، ١١٢،١١٢ب، ١٢٣،١٢٩و١١٣٠،١٣٠ب،١٥٣، ١٦٠،١٦٠=١٦

ب- هەزەجی هەشتی ئەخرەب: (مفعولُ مفاعیلن مفعولُ مفاعیلن)

- سەوداسەرەکەی زولفت ئەزهاری لە کن پەشمە
دوورلەو گوڵە یەعنی ڕووت گوڵزاری لەکن پەشمە (ل١٠١)

- ١١٠٤،١١١٢، ١١٩، ١٣٧=٥

ج- هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەقسوور: (مفعول مفاعیلُ مفاعیلُ فعولان)×٢

ئەی سەروی بڵند قەددو برۆ تاق و مەمک جووت
کێ دەستی دەگاتە بەی و ناری نەگەیشتووت (١٦٠)

- ٦٠ب،٧٦، ٨٥،٨٦=٥

د- هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف: (مفعول مفاعیلُ مفاعیلُ فعولن)×٢

تاتایی سەری تورڕەیی پڕ پێچشی بادا
هەر تاییکی بارێکی گوڵ و نافە بە بادا (٤٤)

- ٤٥،١٤٧،٤٨،٤٩، ٥٠،٥٦،٥٨،١٧٧، ٧٧ب،١٨٢،٨٢ب،٨٤،٨٧،١٨٩،٨٩ب، ١٩٢،٩٩، ١٠٢،١٠٤،ب١٠٥، ١١١، ١١٨، ١٢٠،١١٢١، ١٢٢،١٣٤،١٦٢=٢٨.

هـ- هەزەجی شەشی مەقسوور: (مفاعیلن مفاعیلن فعولان)×٢

مەکە ئیخلافی ئەو وەعدەی کە فەرمووت
دەخیلت بم کە خانەی سەبرەکەم سووت (٥٩)

-٦٥،٧١،١٧٥،١٧٩، ٧٩ب=٦

و- هەزەجی شەشی مەحزووف: (مفاعیلن مفاعیلن فعولن)×٢
جەنابی وەک جینان کردم بەمەئوا
حەبیبەی مالْیاوا مالْی ئاوا (٥١)
- ٦٩، ٩٠، ٩١، ١٩٦، ١٢٥، ١٢٦=٧
سەرجەمی هۆنراوەکانی هەزەج= ١٦+٥+٥+٢٨+٦+٧=٦٧
دووەم: کێشی ڕەمەل: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن)×٢
أ- ڕەمەلی هەشتی مەقسوور: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان)×٢
ئیلتیقای پۆلادو ئاسن هەر نیزاعە و گیرودار
جەمعی مائوناروزەندو زەندەوو مەرخ و عەفار (٦٢)
-٦٤، ٧٣=٣
ب- ڕەمەلی هەشتی مەحزووف: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)×٢
ڕیشەکەی پان و درێژە بۆریا خزمەت دەکا
زاهیرە هەرکەس لەتووڵ و عەرزی ڕیشی دا ڕیا (٤٢)
- ٥٢، ١٥٤، ٥٤، ٥٥، ٥٧، ١٧٢، ٨٨، ٩٢ب، ٩٦ب، ١٠٦، ١٠٨، ١١٤، ١١٥، ١١١٧، ١٢٤، ١٣٣، ١٤٥، ١٦٩ب=١٩
ج- ڕەمەلی هەشتی مەشکوول: (فعلات فاعلاتن فعلات فاعلاتن)×٢
بەریقە لبەرسەر لەبەرقی، تەلەئلوئی لە ئالی
خەسەفەلقەمەر لە ئیشراقی قیامەتی جەمالی (١٢١ب)
١-
د- ڕەمەلی هەشتی مەخبوونی مەقسوور:
(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلان)×٢
لەکنەو جەوهەرە فەردە لە هەیوولا نییە باس
لەحیکەم پەروەریی بوو عەلی سینا نییە باس (٦٦)
١-
هـ- ڕەمەلی هەشتی مەخبوونی مەحزووف: (فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن)×٢
لایقی مەخزەنی تەبعە هەمو کەنزی غەزەلم
قابیلی زەربی ڕەواجە زەڕوزیوی مەسەلم (٧٨)
- ٩٥، ١٠٣ب، ١١٣، ١١٦، ١١٧ب، ١٣١، ١٥٩، ١١٦٩=٩
و- ڕەمەلی هەشتی مەخبوونی ئەسلەم موسەببەغ: (فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لان)×٢
ا بروان تو طبیبان دل افکاراننند
هر دو پیوسته از ان بر سر بیمارانند (٦١)
١ -
ز- ڕەمەلی هەشتی مەخبوونی ئەسلەم: (فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لن)×٢

جۆششی تاوه لەنێو دیدەیی گریانمدا
چ تەنوورێکە لەتەندورەیی تۆفانمدا (٤١)

-٧٢ب، ٩٨ب =٣

ح- ڕەمەلی شەشی مەقسوور: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلان)×٢

گەر دەپرسی من لە بەرچی کەم دەخۆم
من بە برسی قەت مەزانە غەم دەخۆم (٧٤)

-٨٠=٢

ط- ڕەمەلی شەشی مەحزووف: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)×٢

خاوو بێ خاوی دو زولفی خاوو مەز
چاوەچاوی یەک غەزالەی چاوومەز (٦٣)

-١

ی- ڕەمەلی شەشی مەخبوونی مەحزووف: (فاعلاتن فعلاتن فعلن)×٢

پێچەیی پەرچەمی یو پرچی سیا
هەر دەڵێی مانگەشەوە کوڵمی تیا (٥١ب)

-٦٧أ =٢

سەرجەمی هۆنراوەکانی ڕەمەل=٣+١٩+١+١+٩+١+٣+٢+١+٢=٤٢

سێیەم: کێشی موزاریع: (مفاعیلن فاع لاتن مفاعیلن)×٢

أ- موزاریعی هەشتی ئەخرەب: (مفعول فاع لاتن مفعول فاع لاتن)×٢

دەستم لە گەردەنی خۆت هەڵ مەگرە ئەی حەبیبە
وەبزانە خوێنی خۆمە یا میننەتی ڕەقیبە (٩٣)

-١

ب- موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەقسوور: (مفعول فاع لات مفاعیل فاع لان)×٢

سابوونی کەففی پێتە کەفی زاری چاپلووس
خاسی یەتی ڕەقی هەیە نەرمی زمانی لووس (٦٧ب)

-٦٨، ٧٠، ١٤٠=٤

ج- موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف: (مفعول فاع لات مفاعیل فاع لن)×٢

بنوارە وشکە سۆفی یو ڕەقسی بەهەڵهەڵە
دیسان لەبەحری وشکی هەوا کەوتە پێ مەڵە (١١٠٠)

-١٠٨ب، ١٣٢، ١٤٧=٤

سەرجەمی هۆنراوەکانی موزاریع: ١+٤+٤=٩

چوارەم: کێشی موجتەس(مستفع لن فاعلاتن فاعلاتن)×٢

-موجتەسی هەشتی مەخبوونی ئەسلەم موسەبیەغ: (مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع

لان)×٢

شەوی بەهاری جەوانی خەوێ بو پرتەشویر
لەفەجری پایزی پیری بەیانی دا تەعبیر (١٣٨)

-١

سەرجەم هۆنراوەکانی موجتەس=١

پێنجەم: ڕەجەز(مستفعلن مستفعلن مستفعلن)×٢

-ڕەجەزی هەشتی مەتوی مەخبوون: مفتعلن مفاعلن مفتعلن مفاعلن)×٢

ئەحوەلی تەفرەقە نەزەر تەقویەتی سەبەب دەکا
عارفی وەحدەت ئاشنا لەم قسەیە ئەدەب دەکا (٥٣)

-١

سەرجەمی هۆنراوەکانی ڕەجەز:١

شەشەم: بەسیت:(مستفعلن فاعلن مستفعلن فاعلن)×٢

-بەسیتی هەشتی مەتوی:(مفتعلن فاعلن مفتعلن فاعلن)×٢

دووری لەمن خستەوە بێ سەبەبێ یاری من
باری خودایا کە تۆ بگری سەبەبکاری من (٨٣)

-١

سەرجەمی هۆنراوەکانی بەسیت:١

حەفتەم: کێشی تەویل: (فعولن مفاعیلن فعولن مفاعیلن)×٢

-تەویلی هەشتی مەقبووز:(فعولن مفاعیلن فعولن مفاعلن)×٢

دەروونی لیداریشما ڕەزووری وەبەردیهی
کەفرمێسکی گەرمیین ئیلا ئاوی سەردیهی (١٢٧)

-١

سەرجەمی هۆنراوەکانی تەویل:١

سەرجەمی هۆنراوەکانی دیوانی نالی: ٦٧+٤٢+٩+١+١+١+١=١١٢

هەندێ ساڵ، لە بەشی کوردی، یەک دوو قوتابی پۆلی چوارەم بەپێی ئەم پرۆگرامەو لەژێر چاودێری ئێمە لە کێشی شاعیرە کلاسیکییەکانی کوردیان کۆڵیوەتەوە، تەنانەت هەندێکیان باسەکانیان لە گۆڤارەکاندا بڵاویش کردۆتەوە، جگە لەوەی هەندێ لەو برادەرانەی نامەی ماستەریان لەسەر شیعری شاعیرێکی تایبەتی نووسیوە، لەسەر ڕێنمایی ئێمە، ئەم پرۆگرامەی ئێرەیان پەیڕەوکردووە.

بەڵام من خۆم لەم ڕابەرەدا ئەم پرۆگرامەم بەکارنەهێنا لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

١- مەرج نییە دیوانی هەر شاعیرێک تەنیا یەک چاپی هەبێ تا هەموو خوێنەران بگەڕێنەوە سەر لاپەڕەکانی بۆ دیارکردنی کێشەکان. بۆ نموونە هەر نالی چەندەها دیوانی جۆراوجۆری ئێستا لەبەردەستدایە: چاپی گیوی موکریانی، چاپی مەلاعەبدولکەریمی

موددەریس، چاپی دکتۆر مارف خەزنەدار.. دابەشبوونی شیعرەکان لە دیوەکان و لاپەڕەی شیعرەکان بە هیچ جۆرێ وەکو یەک نییە.. بۆیە ناکرێ سوود لەم پرۆگرامە وەربگیرێ بۆ هەموو چاپەکان.. ئەوەی بیەوێ کێشی شیعرێک وەربگرێ هەردەبێ بگەڕێتەوەسەر ئەو چاپەی پرۆگرامەکەی لەسەرکراوە.

٢- لەوانەیە لەدوارۆژدا ئەم دیوانانە چاپی تریان بکرێ و بەشێوەی تر ڕێک بخرێن بەمەش دووبارە ژمارەی لاپەڕەکانیان تێک دەچێ و پرۆگرامەکە [illegible] خوێنەر نادا.

**پرۆگرامی دووەم:**

لە پێشەوە هەموو کێشەکان و قاڵبەکێشەکانم بەناوو پێیەکانەوە نووسی و ژمارەیەکم دایە کێشەکان ١،٢،٣.. و تیپێکم بۆ قاڵبە کێشەکان دانا أ.ب.ج.. ئینجا بۆ دۆزینەوەی کێشەکانی هەر دیوانێک دوو جۆر خشتەم دانا:

لە خشتەی یەکەمدا:

١- بەڕێز لاپەڕەی یەکە یەکەی شیعرەکانی دیوانەکەم نووسی و بەرامبەر ژمارەی لاپەڕەکە، ژمارەی کێشەکەو ژمارەی قاڵبە کێشەکەم نووسی.

٢- لەخشتەی دووەمدا:

یەکەمجار ژمارەی کێشەکەو تیپی قاڵبەکەم نووسی ئینجا ئەو شیعرانەی سەربەو قاڵبە کێشەن یەکە یەکە ژمارەی لاپەڕەکانم لەتەک نووسی.

بەم جۆرە خوێنەر دەتوانی بەهەر خشتەیەکی بیەوێ مەبەستی خۆی بێنێتە دی، ئەگەر بیەوێ بزانێ شیعرێک لە چ کێش و قاڵبێکە، بە لاپەڕەی شیعرەکە دەچێتەوە سەر خشتەی یەکەم و کێشەکەی دەدۆزێتەوە، خۆ ئەگەر بیەوێ بزانێ لە فلانەکێشدا چەند هۆنراوەی بەکارهێناوە ئەوا بە خشتەی دووەم لەبەرامبەر هەر قاڵبەکێشێک لاپەڕەکان دەدۆزێتەوە.

بۆ ئەم پرۆگرامە ناتوانم هەموو کێش و قاڵبەکان لێرە بنووسمەوە، چونکە جێگایەکی زۆر دادەگرێ، تەنیا بەشی کێشی هەزەج دەنووسمەوە کە لە لیستی کێش و قاڵبەکانی لای من، ژمارە(٦) بە کێشی هەزەج دراوە و ئەمەش قاڵبەکانی:

(٦) - کێشی هەزەج: (مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)×٣

(٦-١)هەزەجی هەشتی موسەببەغ: (مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلان)×٢

(٦-٢) هەزەجی هەشتی تەواو: (مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)×٢

(٦-٣) هەزەجی هەشتی ئەخرەبی موسەببەغ: (مفعول مفاعیلن مفعول مفاعیلان)×٢

(٦-٤) هەزەجی هەشتی ئەخرەب: (مفعول مفاعیلن مفعول مفاعیلن)×٢

(٦-٥) هەزەجی هەشتی مەقسوور: (مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن فعولان)×٢

(٦-٦) هەزەجی هەشتی مەحزووف: (مفاعیل مفاعیلن مفاعیلن فعولن)×٢

(٦-٧) هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەقسوور: (مفعول مفاعیل مفاعیل فعولان)×٢

(٦-٨) هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف: (مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن)×٢
(٦-٩) هەزەجی هەشتی ئەخرەبی ئەهتەم: (مفعول مفاعلن مفاعیل فعول)×٢
(٦-١٠) هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەقبووزی ئەزەل: (مفعول مفاعلن مفاعیلن فاع)×٢
(٦-١١) هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەجبووب: (مفعول مفاعلن مفاعیل فعل)×٢
(٦-١٢) هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی ئەبتەر: (مفعول مفاعیل مفاعیل فع×٢)
(٦-١٣) هەزەجی شەشی موسەببەغ: (مفاعیل مفاعیلن مفاعیلان)×٢
(٦-١٤) هەزەجی شەشی تەواو(سالم) : (مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)×٢
(٦-١٥) هەزەجی شەشی مەقسوور: (مفاعیلن مفاعیلن فعولان)×٢
(٦-١٦)هەزەجی شەشی مەحزووف: (مفاعیلن مفاعیلن فعولن)×٢
(٦-١٧) هەزەجی شەشی ئەخرەبی مەقبووزی مەحزووف: (مفعول مفاعلن فعولن)×٢
(٦-١٨) هەزەجی چواری موسەببەغ: (مفاعیل مفاعیلان)×٢
(٦-١٩) هەزەجی چواری تەواو: (مفاعیلن مفاعیلن)×٢
(٦-٢٠) هەزەجی چواری ئەخرەب: (مفعول مفاعیلن)×٢
ئێستاش دیوانی نالی چاپی د. مارف وەک نموونە وەردەگرین:
١- خشتەی یەکەم:
٤٤(٦-٨)
٤٥(٦-٨)
٤٧أ(٦-٨)
٤٧ب(٦-٢)
٤٨(٦-٨)
٤٩(٦-٨)
٥٠(٦-٨)
٥١أ(٦-١٦)
٥٦(٦-٨)
٥٨(٦-٨)
٦٠(٦-٧)
لێرەدا یەکەمیان وەربگرین واتە: شیعری لاپەڕەی چل و چوار لەسەر کێشی ژمارە شەشە کە لە لیستی پێشەوە نووسراوە هەزەجە و لە هەزەجیش قالبی (٨)ـە کە لە لیستەکەدا نووسراوە: هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف، واتە شیعرەکە لەسەر ئەم قاڵبە کێشەیە:

**هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف (مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن)×٢**

٢- خشتەی دووەم:

| کێش | قالب | لاپەڕە | ژمارەی شیعرەکان | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|---|---|
| ٦ | ٦-١ | ١٢٧ | ١ | |
| | ٦-٢ | ٤٧ب، ٧٥ب، ٨١، ١٢٣، ١٢٩، ١١٣١، ١٣٠ب، ٩٤،٩٧، ١٩٨، ١٠٠ب، ١١٠٣، ١١٠، ١١٢ب، ١٥٣ . | ١٥ | |
| | ٦-٤ | ١١٩، ١٣٧ | ٢ | |

واتە: قاڵبەکێشی ٦-١ کە هەزەجی هەشتی موسەببەغە شیعری لاپەڕە(١٢٧)ی پێ نووسراوە، یان(٦-٢) کە هەزەجی هەشتی تەواوە، شیعرەکانی ئەم لاپەڕانەی پێ نووسراوە: ٤٧ب،٧٥ب،٨١،٩٤،٩٧،١٩٨،١٠٠ب، ١١٠٣، ١١٠، ١١٢ب، ١٢٣، ١٢٩،١١٣١، ١٥٣.

*** پڕۆگرامی یەکەم و دووەم لە وتاری (کێشی شیعری کوردی و فارسییەکانی مەحوی و بەراوردێکی نێوانیان)، گۆڤاری زانکۆی سلێمانی -١٣ پەیڕەوکردووە.**

بەڵام ئەم پرۆگرامەشم لە بەرهەمان هۆیەکانی ڕەت کردنەوەی پرۆگرامی یەکەم، نایە لاوەو هاتمە سەر پرۆگرامی سێیەم.

پرۆگرامی سێیەم: ئەوەیە کە لێرە(لەم ڕابەرەدا) بەکارم هێناوە! دیوانەکانم بەرێز وەرگرتووەو لەهەر دیوانێکدا دێری یەکەمی هەموو شیعرەکانم نووسیوەو لەژێر دێرەکەدا پێیەکان و ناوی قاڵبە کێشەکەم نووسیوە، لە کۆتایی هەر دیوانێکدا ئەژمارێکی شیعرەکان و کێشەکانم کردوەو لە کۆتایی هەموو دیوانەکانیشدا ئەژمارێکی گشتیم بۆ

هەموو هۆنراوەکانی ناو دیوانەکان کردووەو ڕێژەی سەدی کێش و قاڵبەکانم دەرهێناوە، بەمەوەش بۆچوونێکی نزیکەی زۆربەی شیعری کلاسیکی (عەرووزی) کوردیمان بۆ دروست دەبێ.

من ئەم پرۆگرامەم لەبەر ئەم هەموویانە پەسندتر کرد:

١- بۆ خوێنەر ئەوە ئاسانترە کە یەکسەر دێڕی یەکەمی قەسیدەکانی بۆ نووسراوەو پێیەکان و ناوی کێشەکەی ڕاستەوخۆ دراوەتێ، ئەرکی گەڕانەوەی سەر لاپەڕەو خشتە ناکێشێ.

٢- هەرچەندە دێرەکانی یەکەم لە چاپێکی تایبەتی وەرگیراوە، بەڵام بۆ هەموو چاپەکان شیعرەکان هەر هەمان شیعرن و تەنیا لاپەڕەی چاپەکان دەگۆڕێ، ئەمەش گرفت دروست ناکا چونکە خوێنەر دێڕی یەکەمی لەبەردەستدایە.

ئیتر هیوادارم بەم ئەرکە خزمەتێکی بچووکی شیعری کلاسیکی کوردی و خوێنەری کوردم کردبێ بەتایبەتی ئەوانەی بەدوای کێشی شیعری کلاسیکیدا دەگەڕێن..

عەزیز گەردی

# کێش و قاڵبە کێشە عەرووزییەکانی شیعری کلاسیکیی کوردی

لە ئەنجامی دەرهێنانی کێش و قاڵبە کێشە عەرووزییەکانی ئەم کۆمەڵە دیوانە شیعرییە کوردییەی لێرە بەدواوە خراونەتە بەرچاو، دەرکەوت کە ئەم کێش و قاڵبە کێشە عەرووزییانەی خوارەوە لە شیعری کلاسیکیی کوردیدا بەکارهاتوون:

لە بازنەی سێیەمدایە، پێیەکانی ئەمانەن:

(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)×٢

لەکوردیدا ئەم قاڵبانەی هەیە:

**١- هەزەجی هەشتی موسەببەغ:** (مفاعیلن، مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلان)×٢

دوو عەرووزی هەیە: مفاعیلان، مفاعیلن.

لە ڕۆما کەوتە بەرچاوم کەسێکی هائیم و حەیران

بەهەیئەت تێکەییم کوردە بەشێوەی ئەهلی کوردستان(حاجی:٩١)

| له | رۆ | ما | کەو | تە | بەر | چا | وم | کە | سێـ | ـکی | ها | ئیـ | ـم وو | حەیـ | ـران |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| بە | هەپـ | ـنەت | تێ | ـگە | ییم | کور | دە | بە | شێـ | ـوەی | ئەهـ | ـلی | کور | دسـ | تان |
| ب | - | - | - | ب | - | - | - | ب | - | - | - | ب | - | - | - . |
| مـ | ـفا | عيـ | ـلن | مـ | ـفا | عيـ | ـلن | مـ | ـفا | عيـ | ـلن | مـ | ـفا | عيـ | ـلان |

**٢- هەزەجی هەشتی تەواو(سالم):** (مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)×٢

دوو عەرووزی هەیە: مفاعیلن، مفاعیلان.

ڕەقیب و موددەعی فیتنەو عەلاقەی چاوی جادووتن

لەگۆشەی گووشوارەت نایبی هارووت و مارووتن (نالی:٨١)

| ڕە | قیـ | ـب وو | مود | دە | عی | فیتـ | ـنەو | عە | لا | قەی | چا | وی | جا | دوو | تن |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| لە | گۆ | شەی | گوو | ش | وا | ـرەت | نا | یـ | ـبی | ها | ڕوو | ت و | ما | ڕوو | تن |
| ب | - | - | - | ب | - | - | - | ب | - | - | - | ب | - | - | - |
| مـ | ـفا | عيـ | ـلن | مـ | ـفا | عيـ | ـلن | مـ | ـفا | عيـ | ـلن | مـ | ـفا | عيـ | ـلن |

**٣- هەزەجی هەشتی مەقسوور:** (مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن فعولان)×٢

دوو عەرووزی هەیە: فعولان، فعولن.

بەیادی چاوی مەستی تۆیە وا پەیمانە ڕەققاس

بەدەوری شەمعی ڕووتا دڵ وەکوو پەروانە ڕەققاس(خادیم:١٤٩.١)

| به | یا | دی | چا | وی | مەس | تی | تۆ | یە | وا | پەی | ما | نە | ڕەق | قاس |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| به | دەو | ری | شەم | عی | ڕوو | تا | دڵ | وە | کوو | پەر | وا | نە | ڕەق | قاس |
| ب | - | - | - | ب | - | - | - | ب | - | - | - | ب | - | -. |
| مـــ | ـفا | عیـ | ـلن | مـــ | ـفا | عیـ | ـلن | مـــ | ـفا | عیـ | ـلن | فـ | ـعو | لان |

**٤- هەزەجی هەشتی مەحزووف:** (مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن فعولن)×٢.

دوو عەرووزی هەیە: فعولن، فعولان.

لەبەزمی عیشرەتی ئیمشەو مەی و مەعشووق جامع

فیراغولباله عاشق لەم شەوە کەس نابێ مانع (خادیم : ١٥٣.١)

| له | بەز | می | عیش | رە | تی | ئیم | شەو | مە | ی و | مەع | شوو | ق | جا | مع |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| فی | را | غوڵ | با | لە | عا | شق | لەم | شە | وە | کەس | نا | بێ | ما | نع |
| ب | - | - | - | ب | - | - | - | ب | - | - | - | ب | - | - |
| مـــ | ـفا | عیـ | ـلن | مـــ | ـفا | عیـ | ـلن | مـــ | ـفا | عیـ | ـلن | فـ | ـعو | لن |

**٥- هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەقسوور:** (مفعولُ مفاعیلُ مفاعیلُ فعولان)×٢

دوو عەرووزی هەیە: فعولان، فعولن

ماتم وەکو زولفەینی سیەه گرتی سەراپات

پۆشی لە ڕوخت تەعبییەیی بەیدەق و شامات (نالی : ١٣٥)

| ما | تم | وە | کو | زول | فەی | نی | سیـ | یەه | گر | تی | سە | را | پات |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| پۆ | شی | لە | ڕو | خت | تەع | بیـ | یە | یی | بەی | دە | ق و | شا | مات |
| - | - | ب | ب | - | - | ب | ب | - | - | ب | ب | - | -. |
| مفـ | ـعو | ل | مـــ | ـفا | عیـ | ـل | مـــ | ـفا | عیـ | ـل | فـ | ـعو | لان |

**٦- هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف:** (مفعولُ مفاعیلُ مفاعیلُ فعولن)×٢.

دوو عەرووزی هەیە: فعولن، فعولان

ئەی قەلعەیی ماهم کە دەڵێی ئەوجی بورووجی

وەی قوڵلەیی دووری کە دەڵێی قامەتی عووجی(نالی: ١١٨)

| ئەی | قەل | عە | یی | ما | هم | کە | دە | لێی | ئەو | جی | بو | روو | جی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| وەی | قول | لە | یی | دوو | ری | کە | دە | لێی | قا | مە | تی | عوو | جی |
| - | - | ب | ب | - | - | ب | ب | - | - | ب | ب | - | - |
| مفـ | ـعو | ل | مـــ | ـــفا | عیـــ | ـــل | مـــ | ـــفا | عیـــ | ـــل | فـــ | ـــعو | لن |

**٧- هەزەجی هەشتی ئەخرەب:** (مفعول مفاعیلن مفعول مفاعیلن)×٢.

دوو عەرووزی هەیە: مفاعیلن مفاعیلان.

عیشقت کە مەجازی بێ خواهش مەکە ئیللا کچ

شیرین کچ و لەیلا کچ، سەلما کچ و عەزرا کچ (نالی: ١٣٧)

| عیش | قت | کە | مە | جا | زی | بێ | خوا | هش | مە | کە | ئیل | لا | کچ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| شی | رین | ک | چ و | لەی | لا | کچ | سەل | ما | ک | چ و | عەز | را | کچ |
| - | - | ب | ب | - | - | - | - | - | ب | ب | - | - | - |
| مفـ | ـعو | ل | مـــ | ـــفا | عیـــ | ـــلن | مفـ | ـــعو | ل | مـــ | ـــفا | عیـــ | ـــلن |

**٨- هەزەجی هەشتی ئەخرەبی ئەهتەم:** (مفعول مفاعلن مفاعیلُ فعولْ)×٢

چوار عەرووزی هەیە: فعولْ، فعل، فاع، فع.

سەییید نەسەبێ لەنەسلی زەهرایی بەتوول

یەعنی نەتەوەی عەلی فوحوول ئیبنی فوحوول (بێخود: ١٤٥)

| سەی | ید | نە | سە | بێ | لە | نەس | لی | زەه | را | یی | بە | توول |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| یەع | نی | نە | تە | وەی | عە | لی | فو | حوول | ئیب | نی | فو | حوول |
| - | - | ب | ب | - | ب | - | ب | - | - | ب | ب | -. |
| مفـ | ـعو | ل | مـــ | ـــفا | عـــ | ـــلن | مـ | ـــفا | عیـ | ـل | فـــ | ـعول |

**٩- هەزەجی هەشتی ئەخرەبی ئەزەل: (مفعول مفاعلن مفاعیلن فاع)×٢.**
**چوار عەرووزی هەیە: فاع، فعول، فعل، فع.**
**بێخود ئەتەوێ قەسری قەناعەت بێ جێت**
**ڕازی بە بەوەی کەوا خودا داویە پێت (بێخود: ١٤٤)**

| بێ | خود | ئه | ته | وێ | قەس | ری | قه | نا | عەت | بێ | جێت |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| را | زی | به | به | وەی | که | وا | خو | دا | داو | یه | پێت |
| - | - | ب | ب | - | ب | - | ب | - | - | - | - |
| مفـ | ـعو | ل | مـــ | ـــفا | عـ | ـــلن | مـــ | ـــفا | عیـــ | ـــلن | فاع |

**١٠- هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەجبووب: (مفعولُ مفاعلن مفاعیلن فعلْ)×٢**
**چوار عەرووزی هەیە: فعل، فعول، فاع ، فع.**
**ئێمەش دەمرین دەبینە خاکی سەرەڕێ**
**ئەم ڕۆژو شەوە تەنووری سوبحی دەگرێ (حاجی:١٥١)**

| ئێ | مەش | دە | م | رین | دە | بی | نه | خا | کی | سه | ره | ڕێ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ئەم | ڕۆ | ژو | شه | وه | تە | نوو | ری | سوب | حی | ده | گ | ڕێ |
| - | - | ب | ب | - | ب | - | ب | - | - | ب | ب | - |
| مفـ | ـعو | ل | مـــ | ـــفا | عـــ | ـــلن | مـــ | ـــفا | عـــ | ـیل | فـــ | ـعل |

**١١- هەزەجی هەشتی ئەخرەبی ئەبتەر: (مفعولُ مفاعیلُ مفاعیلن فع)×٢.**
**چوار عەرووزی هەیە: فع، فعول، فاع ، فعل.**
**مزگێن ژ مەرا بێتە ژ سور شیرینێ**
**جانی خوەیی شیرین ددەم مزگینێ (جزیری : ٥٠٥)**

| مز | گێن | ژ | مه | را | بێ | ته | ژ | سور | شی | ری | نێ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| جا | نی | خوه | یی | شی | ری | ن ه | د | دم | مز | گی | نێ |
| - | - | ب | ب | - | - | ب | ب | - | - | ب | - |
| مفـ | ـعو | ل | مـــ | ـــفا | عیـــ | ـــل | مـــ | ـــفا | عیـــ | ـــلن | فع |

**١٢- هەزەجی هەشتی ئەخرەبی موسەبیەغ: (مفعول مفاعیلن مفعول مفاعیلان)×٢**

از پیر مغان آمد یارم قدحی در دست

خۆ فیتنە بو پیرایەی فیتنەیشی بەخۆیا بەست (مەحوی: ٣٣٠)

| از | پیـ | ـر | م | غان | آ | مد | یا | رم | ق | دە | حی | دەر | دەست |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| خۆ | فیتـ | ـە | بو | پیـ | را | یەی | فیتـ | نەی | شی | بە | خۆ | یا | بەست |
| - | - | ب | ب | - | - | - | - | - | ب | ب | - | - | .- |
| مفـ | ـعو | ل | مـ | ـفا | عیـ | ـلن | مفـ | ـعو | ل | مـ | ـفا | عیـ | ـلان |

**١٣- هەزەجی شەشی تەواو(سالم): (مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)×٢**

دوو عەرووزی هەیە: مفاعیلن، مفاعیلان.

گیا پڕ بۆنی کوردەو ناوەکەی خاوە

هەموو دەم کەسکە سەوزە ڕووگەش و ماوە (هەرشەمی: ٥٦)

| گـ | ـیا | پڕ | بۆ | نی | کور | دەو | نا | وە | کەی | خا | وە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| هە | موو | دەم | کەس | کە | سەو | زە | روو | گە | ش و | ما | وە |
| ب | - | - | - | ب | - | - | - | ب | - | - | - |
| مـ | ـفا | عیـ | ـلن | مـ | ـفا | عیـ | ـلن | مـ | ـفا | عیـ | ـلن |

**١٤- هەزەجی شەشی مەقسوور: مفاعیلن مفاعیلن فعولان)×٢.**

دوو عەرووزی هەیە: فعولان، فعولن.

کەتۆ قیبلەی دەمت سابێنە قوربان

لەسەر قوبلە دڵم مەشکێنە قوربان (نالی: ٩٠)

| کە | تۆ | قیب | لەی | دە | مت | سا | بێ | نە | قور | بان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| لە | سەر | قوب | لە | د | لم | مەش | کێ | نە | قور | بان |
| ب | - | - | - | ب | - | - | - | ب | - | - ه |
| مـ | ـفا | عیـ | ـلن | مـ | ـفا | عیـ | ـلن | فـ | ـعو | لان |

**١٥- هەزەجی شەشی مەحزووف: مفاعیلن مفاعیلن فعولن)×٢.**

دوو عەرووزی هەیە: فعولن، فعولان.

دەروونم پڕ کەباب و و دەردە بێ تۆ

دڵم گەرم و و هەناسەم سەردە بێ تۆ (نالی: ٩٠)

| دە | روو | نم | پڕ | كە | با | ب وو | دەر | دە | بێ | تۆ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| د | ڵم | گەر | م وو | هە | نا | سەم | سەر | دە | بێ | تۆ |
| ب | - | - | - | ب | - | - | - | ب | - | - |
| مـ | ـفا | عیـ | ـلن | مـ | ـفا | عیـ | ـلن | فـ | ـعو | لن |

**١٦- هەزەجی شەشی ئەخرەبی مەقبووزی مەقسوور:** (مفعولُ مفاعلن فعولان)×٢

دوو عەرووزی هەیە: فعولان، فعولن.

شمشادی خەرام و سەر وی غەنناج

جانان د برت ب عیشوە تاراج (جزیری: ١٦٤)

| شم | شا | دی | خە | را | م و | سەر | وی | غەن | ناج |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| جا | نان | د | ب | رت | ب | عیش | وە | تا | راج |
| - | - | ب | ب | - | ب | - | ب | - | - ە |
| مفـ | ـعو | ل | مـ | ـفا | عـ | ـلن | فـ | ـعو | لان |

**١٧- هەزەجی شەشی ئەخرەبی مەقبووزی مەحزووف:** (مفعولُ مفاعلن فعولن)×٢.

دوو عەرووزی هەیە: فعولن، فعولان.

هەر کوردە لە بەینی کوللی میللەت

بێ بەهرە لە خوێندن و کیتابەت(حاجی: ٢٦٣)

| هەر | کور | دە | لە | بەی | نی | کول | لی | میل | لەت |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| بێ | بەهـ | رە | لە | خوێن | د | ن وو | کی | تا | بەت |
| - | - | ب | ب | - | ب | - | ب | - | - |
| مفـ | ـعو | ل | مـ | ـفا | عـ | ـلن | فـ | ـعو | لن |

**١٨- هەزەجی شەشی مەقبووزی مەحزووف:** (مفاعلن مفاعلن فعولن)×٢.
(مفاعلن مفاعلن فعولن)×٢.
دوو عەرووزی هەیە: فعلون، فعولان
جوانتری لە تۆ نەدیوە قەت چاو
لە دایکی نەبووە کەس بەوێ شیاوێ (حەقیقی: (٨١)

| جو | وان | ت | ری | له | تۆ | نه | دی | وه | قەت | چاو |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| له | دای | کی | نەب | وه | کەس | به | وێ | ش | یا | وێ |
| ب | – | ب | – | ب | – | ب | – | ب | – | – |
| مـ | ـفا | عـ | ـلن | مـ | ـفا | عیـ | ـلن | فـ | ـعو | لن |

**١٩- هەزەجی چواری موسەببەغ:** (مفاعیلن مفاعیلان)×٢.
دوو عەرووزی هەیە: مفاعیلان، مفاعیلن.
بە دل ئیرو خە دەنگم ئەز
ژ مەکرا وان دو سولتانان (باتەیی: ٩٤)

| به | دل | نی | رۆ | خه | دمن | گم | ئەز |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ژ | مەک | را | وان | دو | سول | تا | نان |
| ب | – | – | – | ب | – | – | –ه |
| مـ | ـفا | عیـ | ـلن | مـ | ـفا | عیـ | ـلان |

**٢٠- هەزەجی چواری تەواو: (مفاعیلن مفاعیلن)×٢**
هەڕو صەد جار ژ ئلفاوێ
دبم کەیفێ ل مەیخانێ (خانی: ٨٣)

| هه | ڕو | صەد | جار | ژ | ئل | فا | وێ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| د | بم | کەی | فێ | ل | مەی | خا | نێ |
| ب | – | – | – | ب | – | – | – |
| مـ | فا | عیـ | لن | مـ | فا | عیـ | ـلن |

**٢١- هەزەجی چواری ئەخرەب: (مفعول مفاعیلن)×٢**
ئەو یارە بەرەعنایی
وەک سەروی خەرامانە

| ئەو | یا | ره | به | رەع | نا | یی |
|---|---|---|---|---|---|---|
| وەک | سەر | وی | خه | را | ما | نه |
| – | – | ب | ب | – | – | – |
| مفـ | ـعو | ل | مـ | ـفا | عیـ | ـلن |

**دووەم: کێشی رەمەل:** لە بازنەی سێیەمدایە. پێیەکانی ئەمانەن:

(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن)×٢

لە کوردیدا ئەم قالبانەی هەیە:

**١- رەمەلی هەشتی تەواو (سالم):** (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن)×٢ .

دوو عەرووزی هەیە: فاعلاتن، فاعلاتان.

موحبەتێ میحنەت د زۆرن حوب دبێم بێ شک بەلایە

عومرو ژی خوەش پێ دبوورن سۆتن وو دەردوو بەلایە (جزیری: ٤٤)

| موح | به | تێێ | میح | نەت | د | زۆ | رن | حوب | د | بێم | بێ | شک | به | لا | یه |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| عوم | رو | ژی | خوەش | پێ | د | بوو | رن | سۆ | ت | ن وو | دەر | دوو | به | لا | یه |
| – | ب | – | – | – | ب | – | – | – | ب | – | – | – | ب | – | – |
| فا | عـــ | ـــلا | تن | فا | عـــ | ـــلا | تن | فا | عـــ | ـــلا | تن | فا | عـــ | ـــلا | تن |

**٢- رەمەلی هەشتی مەشکوول:** (فعلات فاعلاتن فعلات فاعلاتن)×٢

دوو عەرووزی هەیە: فاعلاتن، فاعلاتان.

سەنەمێ ژ قەوسی ئەبرۆ دو هیلالی نەو نوماندن

دو کەمان ل بورجی میزان ب غەزەب ل من کشاندن (جزیری: ٣٧٧)

| سه | نه | مێ | ژ | قەو | سی | ئەب | رۆ | دو | هی | لا | لی | نەو | نو | مان | دن |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| دو | که | مان | ل | بور | جی | می | زان | ب | غه | زەب | ل | من | ک | شان | دن |
| ب | ب | – | ب | – | ب | – | – | ب | ب | – | ب | – | ب | – | – |
| فا | عـــ | ـــلا | تن | فا | عـــ | ـــلا | تن | فـــ | ـــعـــ | ـــلا | تن | فا | عـــ | ـــلا | تن |

**٣- رەمەلی هەشتی مەخبوون:** (فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلاتن)×٢

دوو عەرووزی هەیە: فعلاتن، فعلاتان.

فەلەکا ئەتلەسی سەرگەشتە د جاما مەحویابە

مەوج ددەت قولزومی عیشقێ مەل سەر دەست غورابە (جزیری: ٤٣٠)

| فه | له | کا | نەت | له | سی | سەر | گەش | تە | د | جا | ما | مه | حو | با | به |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| مەوج | د | دەت | قول | زو | می | عیش | قێ | مه | ل | سەر | دەس | ت | غو | را | به |
| – | ب | – | – | ب | ب | – | – | ب | ب | – | – | ب | ب | – | – |
| فا | عـــ | ـــلا | تن | فـــ | ـــعـــ | ـــلا | تن | فـــ | ـــعـــ | ـــلا | تن | فـــ | ـــعـــ | ـــلا | تن |

**٤- رەمەلی هەشتی مەقسوور:** (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان)×٢ .

دوو عەرووزی هەیە: فاعلان، فاعلن.

من د دل کوڤان هزارن داغ و کەیبەر بێ حیساب

میحنەتا وەردێن ب خارن وین د دلدا سەد نوشاب (جزیری: ٧٩)

| من | د | دل | کوو | ڤان | هـ | زا | رن | دا | غ و | کەی | بەر | بێ | حی | ساب |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| میح | نە | تا | وەر | دێن | ب | خا | رن | وین | د | دل | دا | سەد | نو | شاب |
| - | ب | - | - | - | ب | - | - | - | ب | - | - | - | ب | ه - |
| فا | عـــ | ـــلا | تن | فا | عـــ | ـــلا | تن | فا | عـــ | ـــلا | تن | فا | عـــ | ـــلان |

**٥- رەمەلی هەشتی مەحزووف:** (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)×٢ .

دوو عەرووزی هەیە: فاعلن، فاعلان.

مووی سپی کردم بە شووشتن ئاوی عەینی شۆرە شەت

شۆرەشەت یەعنی کە تێیدا خود بەخود قەل بوو بە بەت (نالی: ٥٧)

| مووی | ســ | پی | کر | دم | بە | شووش | تن | ئا | وی | عەی | نی | شۆ | رە | شەت |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| شۆ | رە | شەت | یەع | نی | کە | تێی | دا | خود | بە | خود | قەل | بوو | بە | بەت |
| - | ب | - | - | - | ب | - | - | - | ب | - | - | - | ب | - |
| فا | عـــ | ـــلا | تن | فا | عـــ | ـــلا | تن | فا | عـــ | ـــلا | تن | فا | عـــ | ـــلن |

**٦- رەمەلی هەشتی مەخبوونی مەقسوور:** (فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلان)×٢ .

چوار عەرووزی هەیە: فعلان، فعلن، فع لان، فع لن.

- لەم قالبەدا، دەشی (فاعلاتن) لە هەردوو لەتدا یان لە یەکێکیاندا ببێ بەمەخبوون (فعلاتن)

حەک بکەم دەفتەری سەعدی بەدەمی ئەر بە بەیان

بێمە سەر مەدحی دەهانت لە دەما بەندە زمان (سالم: ٩٠)

| حەک | ب | کەم | دەف | تە | ری | سەع | دی | بە | دە | می | ئەر | بە | بە | یان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| بێ | مە | سەر | مەد | حی | دە | ها | نت | لە | دە | ما | بەن | دە | ز | مان |
| - | ب | - | - | ب | ب | - | - | ب | ب | - | - | ب | ب | .- |
| فا | عـــ | ـــلا | تن | فعـــ | ـــعـــ | ـــلا | تن | فـــ | ـــعـــ | ـــلا | تن | فـــ | ـــعـــ | ـــلان |

### ٧- ڕەمەلی هەشتی مەخبوونی مەحزووف: (فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن)×٢ .

چوار عەرووزی هەیە: فعلن، فعلان، فع لن، فع لان.

- لەم قالبەدا، دەشتی (فاعلاتن) لە هەردوو لەتدا یان لە یەکێکیاندا ببێ بەمەخبوون (فعلاتن).

سونبولی توڕڕە کە پەرژینە بە پەهلوویی گوڵا
موویەموو هەریەکە داوێکە لەڕێی مورغی دڵا (سالم: ٢٦)

| سون | بو | لی | تور | ڕە | کە | پەر | ژی | نە | بە | پەهـ | لوو | یی | گو | ڵا |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| موو | بە | موو | هەر | یە | کە | دا | وێ | کە | لە | ڕێی | مور | غی | د | ڵا |
| - | ب | - | - | ب | ب | - | - | ب | ب | - | - | ب | ب | - |
| فا | عـ | ـلا | تن | فـ | ـعـ | ـلا | تن | فـ | ـعـ | ـلا | تن | فـ | ـعـ | ـلن |

### ٨- ڕەمەلی هەشتی مەخبوونی ئەسلەم موسەببەغ: (فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لان)×٢

چوار عەرووزی هەیە: فع لان، فع لن، فعلان، فعلن.

- لە قالبەدا، دەشتی (فاعلاتن) لە هەردوو لەتدا یان لە یەکێکیاندا ببێ بەمەخبوون (فعلاتن).

زالمی دڵڕەقی گرژیی موسلمان ئازار
هەر بە بەئیزایە کە ڕەنگی بکەڕێتە ڕوخسار (مەحوی: ٣٣٧)

| زا | ل | می | دل | ڕە | قی | گر | ژی | ی | مو | سول | مان | ئا | زار |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| هەر | بە | نیـ | زا | یە | کە | ڕەنـ | ـگی | بـ | گە | ڕێ | تە | ڕو | خسار |
| - | ب | - | - | ب | ب | - | - | ب | ب | ب | - | - | -ه |
| فا | عـ | ـلا | تن | فـ | ـعـ | ـلا | تن | فـ | ـعـ | ـلا | تن | فع | لان |

### ٩- ڕەمەلی هەشتی مەخبوونی ئەسلەم: (فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لن)×٢

چوار عەرووزی هەیە: فع لن، فع لان، فعلن، فعلان.

لەم قالبەدا، دەشتێ (فاعلاتن) لە هەردوو لەتدا یان لە یەکێکیاندا ببێ بەمەخبوون (فعلاتن).

دڵ دەڵێ سەیری چەمەن خۆشە جەوابی نادەم
موددەتێکە لە قەفەسدایە عەزابی نادەم (نالی: ٧٢)

| دڵ | دە | ڵێ | سەی | ری | چە | مەن | خۆ | شە | جە | وا | بی | نا | دەم |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| مود | دە | تێ | کە | ل | قە | فەس | دا | یە | عە | زا | بی | نا | دەم |
| - | ب | - | - | ب | ب | - | - | ب | ب | - | - | - | - |
| فا | عـ | ـلا | تن | فـ | ـعـ | ـلا | تن | فـ | ـعـ | ـلا | تن | فع | لن |

**١٠- ڕەمەلی شەشی موسەببەغ: (فاعلاتن فعلاتن فاعلاتان)×٢**

گەلاڕێزانە گیانە بۆ چەمەنزار
هاژە هاژی بای خەزانە ڕووبەڕووی شار (بەختیار زێوەر: ١٩٨)

| که | لا | ڕێ | زا | نه | ک | یا | نه | بۆ | چه | مەن | زار |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ها | ژه | ها | ژی | بای | خه | زا | نه | ڕوو | به | ڕووی | شار |
| - | ب | - | - | - | ب | - | - | - | ب | - | -. |
| فا | عـــ | ـــلا | تن | فا | عـــ | ـــلا | تن | فا | عـــ | ـــلا | تان |

**١١- ڕەمەلی شەشی مەخبوون: (فاعلاتن فعلاتن فعلاتن)×٢**

دوو عەرووزی هەیە: فعلاتن، فعلن.
ڕووی لەناو توڕڕە چرایە لە شەوایە
نەیشەکەر قامەتە قەندی لە لەبایە (سالم: ١٣٧)

| ڕووی | له | ناو | توڕ | ڕه | چ | را | یه | له | شه | وا | یه |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| نەی | شه | کەر | قا | مه | ته | قەند | دی | له | له | با | یه |
| - | ب | - | - | ب | ب | - | - | ب | ب | - | - |
| فا | عـــ | ـــلا | تن | فـــ | ـــعـــ | ـــلا | تن | فـــ | ـــعـــ | ـــلا | تن |

**١٢- ڕەمەلی شەشی مەقسوور: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلان)×٢**

دوو عەرووزی هەیە: فاعلان، فاعلن.
ئەلویداع ئەی مولکی بابان ئەلویداع
ئەلویداع ڕەیحانی جانان ئەلویداع (سالم: ٧٥)

| ئەل | وی | داع | نەی | مول | کی | با | بان | ئەل | وی | داع |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ئەل | وی | داع | ڕەی | حا | نی | جا | نان | ئەل | وی | داع |
| - | ب | - | - | - | ب | - | - | - | ب | -ە |
| فا | عـــ | ـــلا | تن | فا | عـــ | ـــلا | تن | فا | عـــ | ـــلان |

## ١٣- ڕەمەلی شەشی مەحزووف: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)×٢

دوو عەرووزی هەیە: فاعلن، فاعلان.

لێوی تۆ ئەو وەختی سەر ساغر دەچوو
لێوی ساغی خۆزگە لێوی من دەبوو (سالم: ١١١)

| لێ | وی | تۆ | ئەو | وەخ | تی | سەر | سا | غر | دە | چوو |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| لێ | وی | سا | غر | خۆز | گە | لێ | وی | من | دە | بوو |
| - | ب | - | - | - | ب | - | - | - | ب | - |
| فا | عـــ | ـــلا | تن | فا | عـــ | ـــلا | تن | فا | عـــ | ـــلن |

## ١٤- ڕەمەلی شەشی مەخبوونی مەقسوور: (فاعلاتن فعلاتن فعلان)×٢

چوار عەرووزی هەیە: فعلان، فعلن، فع لان، فع لن.

- لەم قالبەدا، دەشێ (فاعلاتن) لە هەردوو لەتدا یان لە یەکێکیاندا ببێ بەمەخبوون (فعلاتن).

غەبغەب و خاڵ و لەب و و توڕڕەیی یار
سونبول و وسیب و بنەفشە و گولە نار (سالم: ٥٧)

| غەب | غە | ب وو | خا | ڵ و | لە | ب وو | تور | رە | یی | یار |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| سون | بو | ل وو | سی | ب و | ب | نەف | شەو | گو | لە | نار |
| - | ب | - | - | ب | ب | - | - | ب | ب | -. |
| فا | عـــ | ـــلا | تن | فـــ | ـــعـــ | ـــلا | تن | فـــ | ـــعـــ | ـــلان |

## ١٥- ڕەمەلی شەشی مەخبوونی مەحزووف: (فاعلاتن فعلاتن فعلن)×٢

چوار عەرووزی هەیە: فعلن، فعلان، فع لن، فع لان.

- لەم قالبەدا، دەشێ (فاعلاتن) لە هەردوو لەتدا یان لە یەکێکیاندا ببێ بەمەخبوون (فعلاتن).

لە تەرەف یارەوە نۆبەی زەفەرە
ئەی دڵ ئامادە بەخوێنت هەدەرە (سالم: ١٢٥)

| لە | تە | رەف | یا | رە | وە | نۆ | بەی | زە | فە | رە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ئەی | د | لا | ما | دە | بە | خوێ | نت | هە | دە | رە |
| - | ب | - | - | ب | ب | - | - | ب | ب | - |
| فا | عـــ | ـــلا | تن | فـــ | ـــعـــ | ـــلا | تن | فـــ | ـــعـــ | ـــلن |

## ١٦- ڕەمەلی شەشی مەخبوونی ئەسلەم موسەببەغ: (فاعلاتن فعلاتن فع لان)×٢

چوار عەرووزی هەیە: فع لان، فع لن، فعلان، فعلن.

- لەم قالبەدا، دەشێ (فاعلاتن) لە هەردوو لەتدا یان لە یەکێکیاندا ببێ بەمەخبوون (فعلاتن).

خەو فناکە دڵم ئازووردە لە زولف
حاڵەتی تەڵخە لە شەودا بێدار (سالم: ٥٧)

| زولف | لە | دە | زۆر | ما | ل | د | کە | نا | ف | خەو |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| -. | ب دار | ب بێ | دا | شەو | لە | خە | تەڵ | تی | لە | حا |
|  | ـو | - | - | - | ب | ب | - | - | ب | - |
|  | لان | فع | تن | ـلا | ـعـ | فـ | تن | ـلا | عـ | فا |

## ١٧- ڕەمەلی شەشی مەخبوونی ئەسلەم: (فاعلاتن فعلاتن فع لن)×٢

چوار عەرووزی هەیە: فع لن، فع لان، فعلن، فعلان.

- لەم قالبەدا، دەشێ (فاعلاتن) لە هەردوو لەتدا یان لە یەکێکیاندا ببێ بەمەخبوون (فعلاتن).

ڕاستە ئەی زولفی سییەھ مارانی
حاریسی گەنجی ڕوخی یارانی(سالم: ١٤٩)

| نی | را | ما | یەھ | سیـ | فی | زول | ئەی | تە | راسـ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| نی | را | یا | خی | ڕو | جی | گەن | سی | ری | حا |
| - | - | - | - | ب | ب | - | - | ب | - |
| لن | فع | تن | ـلا | ـعـ | فـ | تن | ـلا | عـ | فا |

## ١٨- ڕەمەلی شەشی مەجحووفی موسەببەغ: (فاعلاتن فاعلاتن فاع)×٢

سێ عەرووزی هەیە: فاع، فاعلن، فاعلان.

ئیحتیرازا زاهیدان لازم ت بت
گەر ببینن وەجهی خوویێ ڕەند (هەکاری: ١١٥)

| بت | ت | زم | لا | دان | هیـ | زا | زا | را | تی | ئیح |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| - | ب | - ڕەند | یێ | خوو | هی | وەج | تن | بی | ب | گەر |
|  |  | ـو | - | - | ب | - | - | - | ب | - |
|  |  | فاع | تن | ـلا | عـ | فا | تن | ـلا | عـ | فا |

## ٢٠- ڕەمەلی چواری موسەببەغ: (فاعلاتن فاعلاتان)×٢

تۆپەکەم شیرینە شکار
شەکرە سێوێکە خڕوجوان (بەختیار زێوەر: ١١٨)

| تۆ | پە | کەم | شی | ری | نە | شک | لی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| شەک | ڕە | سێ | وێ | کە | خ | ڕوو | جوان |
| – | ب | – | – | – | ب | – | – . |
| فا | عـــ | ـــلا | تن | فا | عـــ | ـــلا | تان |

## ٢٠- ڕەمەلی چواری تەواو (سالم): (فاعلاتن فاعلاتن)×٢

دوو عەرووزی هەیە: فاعلاتن فاعلاتان.

شێخی من شێخ پارسا بوو
کامیل وو ئەهلی خودا بوو (نالبەند: ٥)

| شێ | خی | من | شێخ | پا | ر | سا | بوو |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| کا | می | ل وو | ئەه | لی | خو | دا | بوو |
| – | ب | – | – | – | ب | – | – |
| فا | عـــ | ـــلا | تن | فا | عـــ | ـــلا | تن |

## ٢١- ڕەمەلی چواری مەقسوور: (فاعلاتن فاعلان)×٢

سێ عەرووزی هەیە: فاعلان، فاعلن، فاعلاتن.

گوه بدەن قەولێ مە گۆتی
ئەی عەزیزێت دڵ بژار (نالبەند: ٣، ٢٠٤)

| گوه | ب | دەن | قەو | لێ | مە | گۆ | تی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | – | ب | – | – |
| ئەی | عە | زی | زێت | دڵ | ب | ژار | |
| – | ب | – | – | – | ب | ه – | |
| فا | عـــ | ـــلا | تن | فا | عـــ | ـــلان | |

**٢٢- رەمەلی چواری مەحزووف: (فاعلاتن فاعلن)×٢**
دوو عەرووزی هەیە: فاعلن، فاعلاتن.

ئەی گەلی کوردا بزانن
رابنە سەرخو بەسسە خەو (نالبەند: ٥، )

| ئەی | گە | لی | کور | دا - | ب ب | زا - | نن - |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| راب | نە | سەر | خو | بەس | سە | خەو | |
| - | ب | - | - | - | ب | - | |
| فا | عـــ | ـــلا | تن | فا | عـــ | ـــلن | |

**سێیەم: کێشی موزاریع:** لە بازنەی چوارەمدایە. پێیەکانی ئەمانەن: (مفاعیلن فاع لاتن مفاعیلن)×٢.
لە کوردیدا ئەم قالبانەی هەیە:

**١- موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەقسوور:** (مفعولُ، فاع لات، مفاعیلُ، فاع لان)×٢
دوو عەرووزی هەیە: فاع لان، فاع لن.
قوربان مەحالە پێکەوە بن سەبرو ئیشتیاق.
خاریج لە نەسسی ئایەتە تەکلیفی لایو تاق (نالی: ٦٨)

| قور | بان | مە | حا | لە | پێ | کە | وە | بن | سەب | رو | ئیش | تی | یاق |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| خا | ریج | لە | نەس | سی | ئا | یە | تە | تەک | لی | فی | لا | یو | تاق |
| - | - | ب | - | ب | - | ب | ب | - | - | ب | - | ب | - ه |
| مفـ | ـعو | ل | فا | ع | لا | ت | مـــ | ـــفا | عیـــ | ـــل | فا | ع | لان |

**٢- موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف: (مفعول فاع لات مفاعیل فاع لن)×٢**

دوو عەرووزی هەیە: فاع لن، فاع لان.

ئەمڕۆ بە دڵبەری شەهی هەر مەرزو کیشوەری

سا هەڵسە دەی بنێرە سەرت تاجی سەروەری (سالم: ١٤٥)

| ئەم | ڕۆ | بە | دڵ | بە | ری | شە | هی | هەر | مەر | زو | کیش | وە | ری |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| سا | هەڵ | سە | دەی | ب | نێ | رە | سە | رت | تا | جی | سەر | وە | ری |
| - | - | ب | - | ب | - | ب | ب | - | - | ب | - | ب | - |
| مفـ | ـعو | ل | فا | ع | لا | ت | مـ | ـفا | عیـ | ـل | فا | ع | لن |

**٣- موزاریعی هەشتی ئەخرەبی موسەببەغ: (مفعول فاع لاتن مفعول فاع لاتان)×٢**

دوو عەرووزی هەیە: فاع لاتان، فاع لاتن.

خاکی جزیرو بۆتان یەعنی وڵاتی کوردان

سەد حەیف و سەد مخابن دەیکەن بەئەرمەنستان (حاجی: ٨٥)

| خا | کی | جە | زی | رو | بۆ | تان | یەع | نی | و | لا | تی | کور | دان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| سەد | حەی | ف و | سەد | م | خا | بن | دەی | کەن | بە | ئەر | مە | نس | تان |
| - | - | ب | - | ب | - | - | - | - | ب | - | ب | - | - ە |
| مفـ | ـعو | ل | فا | ع | لا | تن | مفـ | ـعو | ل | فا | ع | لا | تان |

**٤- موزاریعی هەشتی ئەخرەب: (مفعول فاع لاتن مفعول فاع لاتن)×٢**

دوو عەرووزی هەیە: فاع لاتن، فاع لاتان.

ئەی بێ نەزیرو هەمتا هەر تۆی کە بەرقەراری

بێ دارو بێ دیاری بێدارو پایەداری (حاجی: ١٤٣)

| ئەی | بێ | نە | زی | رو | هەم | تا | هەر | تۆی | کە | بەر | قە | را | ری |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| بێ | دا | رو | بێ | د | یا | ری | بێ | دا | رو | پا | یە | دا | ری |
| - | - | ب | - | ب | - | - | - | - | ب | - | ب | - | - |
| مفـ | ـعو | ل | فا | ع | لا | تن | مفـ | ـعو | لُ | فا | ع | لا | تن |

**٥- موزاریعی هەشتی مەکفووفی مەحزووف: (مفاعیل فاع لن مفاعیل فاع لن)×٢**

دەڵێن یاری غونچە لەب ئەوا هاتە شارەوە

ئەنووسێ جەفایی بولبولی دڵ بە زارەوە (دەشتی: ١٠١)

| ده | لێن | یا | ری | غون | چه | لەب | ئه | وا | ها | ته | شا | ره | وه |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ئه | نوو | سی | جه | فا | یی | بول | بو | لی | دڵ | به | زا | ره | وه |
| ب | – | – | ب | – | ب | – | ب | – | – | ب | – | ب | – |
| مــ | ــفا | عیــ | ــلن | فا | ع | لن | مــ | ــفا | عیــ | ــل | فا | ع | لن |

**٦- موزاریعی چواری ئەخرەب: (مفعول فاع لاتن)×٢**

دوو عەرووزی هەیە: فاع لاتن فاع لاتان.

گر یامە تێت بو بابێ

مر ئەم کە تین عەزا بێ (نالبەند: ٣، ١١٠)

| گر | یا | مه | تێت | بو | با | بێ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| مر | ئەم | که | تین | عه | زا | بێ |
| – | – | ب | – | ب | – | – |
| مفـ | عو | ل | فا | عــ | ــلا | تن |

**چوارەم: کێشی ڕەجەز:** لە بازنەی سێیەمدایە. پێیەکانی ئەمانەن:

(مستفعلن مستفعلن مستفعلن)×٢.

لە کوردیدا ئەم قالبانەی هەیە:

١- **ڕەجەزی هەشتی موززال:** (مستفعلن مستفعلن مستفعلن مستفعلان)×٢

دوو عەرووزی هەیە: مستفعلان، مستفعلن.

دیسا ژ نوو بێ حالە دل ساقی وەرین جاما زوجاج

موشتاقی خەمرا ئالە دل لێ خوشە ئانی بت میزاج (جزیری: ١٧٣)

| دی | سا | ژ | نوو | بێ | حا | له | دل | سا | قی | وه | رین | جا | ما | زو | جاج |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| موش | تا | قی | خەم | را | ئا | له | دل | لی | خو | شه | ئا | نی | بت | می | زاج |
| – | – | ب | – | – | – | ب | – | – | – | ب | – | – | – | ب | –ە |
| مســ | ــتفــ | ــعــ | ــلن | مســ | ــتفــ | ــعــ | ــلن | مســ | ــتفــ | ــعــ | ــلن | مســ | ــتفــ | ــعــ | ــلان |

٢- **ڕەجەزی هەشتی تەواو (سالم):** (مستفعلن مستفعلن مستفعلن مستفعلن)×٢

دوو عەرووزی هەیە: مستفعلن، مستفعلان.

خەلقۆ ل من کەن شیرەتێ ئەو دلبەرا زەڕڕین کەمەر

من دی د حالی غەفلەتێ هات دەر ژ بورجێ وەک قەمەر (جزیری: ٢٣١)

| خەل | قۆ | ل | من | کەن | شی | ره | تێ | ئەو | دل | به | را | زەڕ | رین | که | مەر |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| من | دی | د | حا | لی | غەف | له | تێ | هات | دەر- | ژ | بور | جێ | وەک | قه | مەر |
| – | – | ب | – | – | – | ب | – | – |  | ب | – | – | – | ب | – |
| مســ | ــتفــ | ــعــ | ــلن | مســ | ــتفــ | ــعــ | ــلن | مســ | ــتفــ | ــعــ | ــلن | مســ | ــتفــ | ــعــ | ــلن |

**٣- ره‌جه‌زی هه‌شتی مه‌خبوون:** (مفاعلن مفاعلن مفاعلن مفاعلن)×٢

دوو عه‌رووزی هه‌یه: مفاعلن، مفاعلان.

غه‌زالی خۆش خه‌رامی من كه توڕره ئینتیشار ئه‌كا
هه‌زار شێری سه‌فشكه‌ن به رشته‌یێ شار ئه‌كا (بێخود: ٣)

| غه | زا | لی | خۆش | خه | را | می | من | كه | تور | ره | ئین | تی | شار | ئه | كا |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| هه | زا | ر | شێ | ری | سه‌ف | ش | كه‌ن | به | رش | ته | یێ | ش | كا | ره | كا |
| ب | – | ب | –* | ب | – | ب | – | ب | – | ب | – | ب | – | ب | – |
| مـ | ـفا | عـ | ـلن | مـ | ـفا | عـ | ـلن | مـ | ـفا | عـ | ـلن | مـ | ـفا | عـ | ـلن |

**٤- ره‌جه‌زی هه‌شتی مه‌تویِ مه‌خبوونی موززال:** (مفتعلن مفاعلن مفتعلن مفاعلان) ×٢

دوو عه‌رووزی هه‌یه: مفاعلان، مفاعلن.

سه‌ر دده‌ت ئاوی كه‌وسه‌ری زه‌مزه‌مه‌وو سه‌مایی زولف
سایه نومایی خاوه‌ری سیدره‌یی مونته‌هایی زولف (جزیری: ٣٠٧)

| سه‌ر | د | ده | تا | وی | كه‌و | سه | ری | زه‌م | زه | مه | وو | سه | ما | یی | زولف |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| سا | یه | نو | ما | یی | خا | وه | ری | سید | ره | یی | مون | ته | ها | یی | زولف |
| – | ب | ب | – | ب | – | ب | – | – | ب | ب | – | ب | – | ب | – ه |
| مفـ | ـتـ | ـعـ | ـلن | مـ | ـفا | عـ | ـلن | مفـ | ـتـ | ـعـ | ـلن | مـ | ـفا | عـ | ـلان |

**٥- ره‌جه‌زی هه‌شتی مه‌تویِ مه‌خبوون:** (مفتعلن مفاعلن مفتعلن مفاعلن)×٢

دوو عه‌رووزی هه‌یه: مفاعلن، مفاعلان.

وێل و فیراری عیشقی تۆم شه‌هر به‌شه‌هر سوو به‌سوو
پشته به‌پشته ته‌ل به‌ته‌ل ده‌شت به‌ده‌شت كوو به‌كوو (سالم: ١١٢)

| وێ | ل و | فی | را | ری | عیش | قی | تۆم | شه‌هـ | ر | به | شه‌هـ | ر | سوو | به | سوو |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| پش | ته | به | پش | ته | ته‌ل | به | ته‌ل | ده‌ش | ت | به | ده‌ش | ت | كوو | به | كوو |
| – | ب | ب | – | ب | – | ب | – | – | ب | ب | – | ب | – | ب | – |
| مفـ | ـتـ | ـعـ | ـلن | مـ | ـفا | عـ | ـلن | مفـ | ـتـ | ـعـ | ـلن | مـ | ـفا | عـ | ـلن |

**٦- ڕەجەزی هەشتی مەخبوونی موززال:** (مفاعلن مفاعلن مفاعلان)×٢

چ نێرو مێ بەپاش و پێش هەمووش بەبان

هەتا بەبن بەبن ئەوەن چ کچ چ کوڕ چ خۆیشان (ڕەمزی: ٢٣٦)

| چ | نێ | رو | مێ | بە | پا | ش و | پێش | هە | موو | بە | بان | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| هە | تا | بە | بن | بە | بن | ئە | ون | چ | کچ | چ | کوڕ | چ | خۆ | یـ | شان |
| ب | - | ب | - | ب | - | ب | - | ب | - | ب | - | ب | - | ب | -. |
| مـ | ـفا | عـ | ـلن | مـ | ـفا | عـ | ـلن | مـ | ـفا | عـ | ـلن | مـ | ـفا | عـ | ـلان |

**٧- ڕەجەزی هەشتی مەقتووع:** (مستفعلن مستفعلن مستفعلن مفعولن)×٢

قوربانی چاوی پڕ لە غەمزەو زولفی سییاهت بم

حەیرانی لێوی پڕ لە خەندەو تەرفی کولا هت بم (سەفوەت: ٥٦)

| قور | با | نی | چا | وی | پڕ | لە | غەم | ڕەو | زول | فی | سی | یا | هت | بم |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| قور | با | نی | لێ | وی | پڕ | لە | خەن | دەو | تەر | فی | کو | لا | هت | بم |
| - | - | ب | - | - | - | ب | - | - | - | ب | - | - | - | - |
| مسـ | ـتفـ | ـعـ | ـلن | مسـ | ـتفـ | ـعـ | ـلن | مسـ | ـتفـ | ـعـ | ـلن | مفـ | ـعو | لن |

**٨- ڕەجەزی هەشتی مەتوی موخەللەع:** (مفتعلن فعولن مفتعلن فعولن)×٢

مۆژدە بدەن بەیاران یادی سەبا لەڕێیە

هو هودی خۆش خەبەرهات نامەی ویسالی پێیە (عەونی: ٢٢٨)

| موژ | دە | ب | دەن | بە | یا | ران | با | دی | سە | با | لە | ڕێ | یە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| هود | هو | دی | خۆش | خە | بەر | هات | نا | مەی | وی | سا | لی | پێ | یە |
| - | ب | ب | - | ب | - | - | - | - | ب | - | ب | - | - |
| مفـ | ـتـ | ـعـ | ـلن | فـ | ـعو | لن | مفـ | ـتـ | ـعـ | ـلن | فـ | ـعو | لن |

**٩- ڕەجەزی شەشی مەقتووع:** (مستفعلن مستفعلن مفعولن)×٢

کوردێ برا بو من موعین بن خێرە
یا بی شکە دێ بو هەوا بن گێرە (نالبەند: ٥،.....)

| کور | دێ | ب | را | بو | من | مو | عین | بن | خێ | ڕە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| یا | بی | ش | کە | دێ | بو | هە | وا | بن | گێ | رە |
| - | - | ب | - | - | - | ب | - | - | - | - |
| مـــ | ـــتفـــ | ـــعـــ | ـــلن | مـــ | ـــتفـــ | ـــعـــ | ـــلن | مفـــ | ـــعو | ـــلن |

**١٠- ڕەجەزی شەشی تەواو:** (مستفعلن مستفعلن مستفعلن)×٢

بێچارە ماوە دڵ لە دووری یارەوە
کەوتۆتە زنجیری فیراقی یارەوە (دەشتی: ٨٣)

| بێ | چا | رە | ما | وە | دڵ | لە | دوو | ری | یا | رە | وە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| کەو | تو | تە | زن | جی | ری | فی | را | قی | یا | رە | وە |
| - | - | ب | - | - | - | ب | - | - | - | ب | - |
| مـــ | ـــتفـــ | ـــعـــ | ـــلن | مـــ | ـــتفـــ | ـــعـــ | ـــلن | مـــ | ـــتفعـــ | ـــعـــ | ـــلن |

**١١- ڕەجەزی چواری مورەففەل:** (مستفعلاتن مستفعلاتن)×٢

بولبول بەنەغمەی دڵکێش و خۆشی
گوڵزاری پڕکرد دەنگ وو خرۆشی (زێوەر: ١١٩)

| بول | بول | بە | نەغ | مەی | دل | کێ | ش و | خۆ | شی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| گوڵ | زا | ری | پڕ | کرد | دەن | گ وو | خ | رۆ | شی |
| - | - | ب | - | - | - | - | ب | - | - |
| مـــ | ـــتفـــ | ـــعـــ | ـــلا | تن | مـــ | ـــتفـــ | ـــعـــ | ـــلا | تن |

**١٢- ڕەجەزی چواری تەواو (سالم): (مستفعلن مستفعلن)×٢.**
دوو عەروزی هەیە: مستفعلن مستفعلان
نەڤ کەڤنە دنیا بێ بەقا
نێکی دەوام ژین لێ نەما (ناڵبەند:٣،٥،٤٠)

| نەڤ | کەڤ | نە | دن | یا | بێ | ب | قا |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| نێ | کی | دە | وام | ژین | لێ | نە | ما |
| - | - | ب | - | - | - | ب | - |
| مســ | ـتفـ | ـعـ | ـلن | مــ | ـتفـ | ـعـ | ـلن |

**١٣- ڕەجەزی چواری موززال: (مستفعلن مستفعلان)×٢.**
یا ڕەب هەوار سەد جار هەوار
پەروان و قەت ناگرن قەرار (ناڵبەند:٣،٥،٤٠)

| یا | ڕەب | هە | وار | سەد | جار | هە | وار |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| پەر | وا | ن و | قەت | ناگـ | رن | قە | رار |
| - | - | ب | - | - | - | ب | - . |
| مــ | ـتفـ | ـعـ | ـلن | مــ | ـتفـ | ـعـ | ـلان |

**١٤- ڕەجەزی چواری مەخبوون: (مفاعلن مفاعلن)×٢.**
لە شۆخ و شەنگی پارەوە
لە ڕازی پڕ نیهانییا (ناڵبەند:٣،٥،٤٠)

| لە | شۆ | خ و | شەن | گی | پا | رە | وە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| لە | را | زی | پڕ | نی | ها | نی | یا |
| - | - | ب | - | - | - | ب | - |
| مــ | ـفا | عــ | ـلن | مــ | ـفا | عــ | ـلن |

**١٥- ڕەجەزی چواری مەتوی مەخبوون: (مفتعلن مفاعلن)×٢.**
عاشقی بێ جەگەر مەگەر
سەبری ژ جان و دل دکەت (خانی:٥٥)

| عا | ش | قی | بێ | جە | گەر | مە | گەر |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| سەب | ری | ژ | جا | ن و | دل | د | کەت |
| - | ب | ب | - | ب | - | ب | - |
| مفـ | ـتـ | ـعـ | ـلن | مـ | ـفا | عـ | ـلن |

**پێنجەم: کێشی خەفیف:** (لە بازنەی چوارەمدایە. پێیەکانی ئەمانەن:
(فاعلاتن مستفع لن فاعلاتن)×٢
لە کوردیدا ئەم قالبانەی هەیە:
**١- خەفیفی شەشی مەخبوونی مەقسوور:** (فاعلاتن مفاعلن فعلان)×٢ .
چوار عەرووزی هەیە: فعلان، فعلن، فع لان، فع لن.
لەم قالبەدا، دەشێ (فاعلاتن) لە هەر دوو لەتدا یان لە یەکێکیاندا ببێ بەمەخبوون (فعلاتن)
غەم وەکوو کۆه و تەن زەعیف و نزار
دڵ یەکێ غائیلەی زەمانە هەزار (سالم: ٥٩)

| غەم | وە | کوو | کۆ | هـ و | تەن | زە | عی | ف و | ن | زار |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| دل | یە | کێ | غا | ئی | لەی | زە | ما | نە | هە | زار |
| - | ب | - | - | ب | - | ب | - | ب | ب | - ه |
| فا | عـ | ـلا | تن | مـ | ـفا | عـ | ـلن | فـ | ـعـ | ـلان |

**٢- خەفیفی شەشی مەخبوونی مەحزووف: (فاعلاتن مفاعلن فعلن)×٢**
چوار عەرووزی هەیە: فعلن، فعلان، فع لن، فع لان.
- لەم قالبەدا، دەشێ (فاعلاتن) لە هەردوو لەتدا یان لە یەکێکیاندا ببێ بەمەخبوون (فعلاتن).
بەنەزاکەت نییە گوڵ وەک بەدەنت
خونچە دڵ تەنگە لە حەسرەت دەهەنت (سالم: ٥٣)

| بە | نە | زا | کەت | نی | یە | گوڵ | وەک | بە | دە | نت |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| غون | چە | دڵ | تەن | گە | لە | حەس | رەت | دە | هە | نت |
| - | ب | - | - | ب | ب | - | - | ب | ب | - |
| فا | عـ | ـلا | تن | فـ | ـعـ | ـلا | تن | فـ | ـعـ | ـلن |

